زنجیره (2) (رێگای خودا ) ( طریق الله ) (allah way)




# (چەند وانەیەك لە زانستەكانی قورئان)

وەرگێران و ئامادەكردنی : باوكی هاوڕێ

2016-2015

تێبینی : مافی بلاوكردنەوەی بۆ هەمو موسلمانێكە بەو مەرجەی گۆرانكاری بەسەردا نەهێنێت.

## پێشەکی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على محمد وعلى اله واصحابه اجمعين اما بعد: **رێزو گەورەیی هەمو شتێك لە رێزو گەورەیی بابەتەکەی دایە ،بابەتی ئیمەش بابەتی زانستەکانی قورئانە قورئانیش قسەی خودایە، کە هۆکارێکە لە تاریکی بەرەو روناکی بڕۆین ، وە پێغەمبەری خودا دەفەرموێت :( لە دوای خۆم دوو شتم بۆ جێهێشتوم ئەگەر دەستی پێوە بگرن هەرگیز گومڕا نابن ئەوەیش قورئان و فەرمودەیە ) ، لەم فەرمودەیە بۆمان دەرکەوت رێگای رزگار بون تەنها قورئان و فەرمودەیە هیچ شتێکی تر نیە ، کەواتە با خۆمان فێری قورئان و فەرمودە بکەین و فێری زانستەکانی ببین بۆ ئەوەی بە باشی لێی تێبگەین ، وە رێگای راست و رەوان بگرین و لانەدەین ،هەر وەکو جارێکیان پێغەمبەری خودا خەتێکی راستی کردوو لە پاڵ خەتەراستەکە چەند خەتێکی تری کرد وتی** (وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ )**وتی هێلە راستەکە ئیسلامە وە هێلە خوارەکانیش هێلی شەیتانە وە داوامان لێدەکات کە بەدوای هێلی راست برۆین ، بابەتی زانستی قورئان بابەتێکی یەکجار گرنگە کە پێویستە تاکی موسولمان خۆی لێ بەهرەمەند بکات وە خەلکانی تریش فێری ئەو زانستە بکات هەروەکو پێغەمبەر دەلێت: ( بلغوا عنی ولو آیة )بیگەیەنە ئەو دینە پاکە لەمنەوە ئەگەر یەك ئایەتیش بێت،**

**#ئاما نجەکانی زاستەکانی قورئان.**

1- **ئاشنابونمان لە زانستەکانی قورئان بۆ تێگەیشتێکی تەواو.**
2- **زیادبونی زانست و زانیاری قوتابی لەسەر بابەتە هەستیارو گرنگەکانی قورئان .**
3- **هاندانی قوتابی لەسەر فێربونی قورئان و وە بەرگری کردن لێی.**

**#گرنگی زانستەکانی قورئان**

1- **یارمەتیت دەدات لە تێگەیشتن و لێ وردبونە لە قورئان ،وە دەرهێنانی حوکمەکانی ،وە زانینی حوکمەکەی ،وە تێگەیشتنی ( متشابە ) کانی بە شێوەیەکی راست و رەوان ،لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك ناتوانێت لە قورئان تێبگات و تەفسیریان بکات کە نەزانێت چۆنیەتی دەربرینی ،وە نوسینەکەی ،جۆرەکانی خوێندنەوەی ،وەهۆکاری دابەزینی ،و ناسخ و منسوخ ، و محکمە ومتشابە ، ئەوانە کۆڵەگەن و وە کلییلن بۆ تێگەیشتن لە قورئان .**

2- **زۆربونی باوەر و یەقین بەو قورئانە ،بەتایبەت کە ئەوانەی کە دەچنە ناو بابەتی ئیعازەوە ،وە ئەحکامەکانی ،وە رادەوەستن لە ئەو شتانەی کە پەنهان ،ئەگەر ئەو شتانە نەزانێت ئەوە رەنگە گومان بچێتە ناو دلیەوە .**

3- **وە زانینی ئەو هەول و کۆششانەی کە دراون لە مێژوودا کە زانایان چەند ماندوو بونە بۆ گەیاندنی ئەو هەمو زانستە بەسودانە .**

4- خۆپرچەك كردن بە زانست و زانیاری بۆ بەرگری كردن لەو قورئانە عەزیزە دژی ئەوانەی كە گومان دروست دەكەن لە ناو دلی باوەردارانـدا .

5- بەدەست هێنانی ئەجرو پاداشت ،ئەگەر فێری ئەو زانستانە بێت .

6- پاكردنەوەی دڵ و وە راهێنانی نەفس لەسەر كاری چاك ،وە زۆربونی ئیمان .

7- وە هاوەڵان زۆر هەوڵیان دەدا كە لە قورئان تێبگەن و لە بەری بكەن و وە كاریشی پێبكەن ،هەر وەك لە عبد الرحمن ی السلمی دا هاتوە : ( ئیمە 10 – 10 ئایە تمان لە پێغەمبەر وەردەگرت و لەبەرمان دەكرد و وە لێی تێدەگەیشتین و وە كارمانیش پێدەكرد ).

8- سەرەتا پێغەمبەر رێگەی نەدا هیچ شتێك بنوسنەوە جگە لە قورئان ، لەبەر ئەوەی تێكەڵ نەبێت لەگەل قورئان ،هەروەكو لەو فەرمودەیە هاتوە : ( لاتكتبوا عني ،ومن كتب عني غير القرآن فليمحه،حدثوا عني ولا حرج ومن كذب على متعمدا فليتبوأ مقعده من النار )

9- ابن مسعودەوە بۆمان دەگێرێتەوە : ( والله كە هیچ خودایەك نیە بە حەق جگە لەو ،هیچ ئایەتێك نەهاتۆتە خوارەوە لە پەرتوكی خودا كە من نەی زانم كە بۆسەر كێ دابەزیوە وە لە كوێ هاتۆتە خوارەوە ، وە بزانم كەسێك شارەزایە لە پەرتوكی خودا الا بە سوار چاك دەچمە لای )

10- زانایان ئەم زانستەیان بە گەورەترین و پربایەخترین زانست ناویان هێناوە ،وە گرنگیەكی ئێجگار زۆریان پێداوە،

## #واتای قورئان :

لە سەر رەچەلەكی وشەی قورئان زانایان راجیاوازیان هەیە، هەندێك دەڵێن رەچەلەكەكەی لە وشەی ( قرأ ) وە هاتوە ، وە ( قرأ ) هەندێك جار بە مانای : كۆكردنەوە و درانە پال یەكتری دێت .

وە ( القراء ة ) بەمانای درانە پاڵ یەكتری ووشەكان دێت ، وەهەندێك دەلێن وشەی قورئان اصلەكەی ( القراءة ).

وە هەندێك زانا دەفەرمون : لەبەر ئەوەی ناونراوە قورئان لەبەر گشتگیری و پر بە پێیتی پەرتوكەكەیە ،وە لەبەر ئەوەی هەمو زانستەكانی تێدا كۆ بویتەوە .

پێناسەی قورئان لە لای زانایان : ئەو پەرتوكەیە كە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر ،خوێندنەوەی پەرستنە( عبادەتە )

## ناو و سیفەتەكانی قورئان :

1- **"الكتاب" :** ( لَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ) **واتا :** سوێند بەخوا بێگومان ئێمە كتێبێكمان ڕەوانە كردووە بۆتان كە یاداوەریە و سەربەرزی ئێوە لە شوێنكەوتنیایەتی، ئایا ئەوە بیرو هۆشتان ناخەنەكار و ژیر نابن؟

2- **"الفرقان"**: (تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا) **واتا :** بەرزو پیرۆزو پاک و بڵندە ئەو زاتەی کە قورئانی دابەزاندووە تا ببێتە جیاکەرەوەی ڕاست و ناڕاست، بۆ سەر بەندەی خۆی (محمد صلى الله عليه وسلم) تا ببێتە هۆشیار کەرەوەو بێدارکەرەوەی دانیشتوانی جیهان لە هەموو سەردەمێکدا.

3- **"الذكر"**: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) واتا : بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێ بخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە).

4- **"التنزيل"**: (وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ) واتا : بە ڕاستی ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە ڕەوانە کراوە.

5- **" نور " ( يأيها الناس قد جاءكم برهان من ربكم وأنزلنا إليكم نوراً مبيناً ).**

6- **و" هدى" و" شفاء" و" رحمة" و" موعظة" ( يأيها الناس قد جاءتكم موعظة من ربكم وشفاءٌ لما في الصدور وهدىً ورحمة للمؤمنين ).**

7- **و" مبارك" ( وهذا كتابٌ أنزلناه مباركٌ مصدِّقُ الذي بين يديه ).**

8- **و" مبين" ( قد جاءكم من الله نورٌ وكتابٌ مبين ).**

9- **و" بشرى" ( مصدقاً لما بين يديه وهدىً وبشرى للمؤمنين ).**

10- **و" عزيز" ( إن الذين كفروا بالذكر لما جاءهم، وإنه لكتابٌ عزيز ).**

11- **و" مجيد" ( بل هو قرآنٌ مجيد ).**

12- **و" بشير" و" نذير" ( كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ * بَشِيراً وَنَذِيراً ).**

**ناوو سیفەتەکانی قورئان گەلێك زۆر بەلاّم بەوەندە کۆتایی دەهێنم .**

**#جیاوازی نێوان قورئان و فەرمودەی قودوسی .**

**1- قورئان قسەی خودایە بەسروش هاتۆتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر بە دەربڕینەوە ،وە تەحەدای هەمو عەرەبی کرد بەو قورئانە ،عەرەب دەستە وەستان بون لە هێنانی وێنەیەك یان 10 سورەت یان یەك سورەتی کورت. وە ئێستاش ئەو تەحەدایە هەر ماوە و هەر دەمێنێت ،قورئان معجزەیەکە تا رۆژی دوایی .**

**-فەرمودەی قودوسی ئەو تەحەدایەی تێدانیە وە ئیعجازەکەشی وەك ئیعجازی قورئان نیە .**

**2- قورئان نادرێتە پال هیچ کەس تەنها خودا نەبێت دەلێن خودا دەفەرموێت .**

**- فەرمودەی قودوسی دەگێردرێتەوە لە پێغەمبەر دەلێین پێغەمبەر دەفەرموێت لە فەرمودەیەکی قودوسی .**

**3- قورئان هەموی گێردراوەتەوە بە ( تواتر ) وە تەواتوریش ( قطعي الثبوت ) .**

**- فەرمودەی قودوسی زۆربەی زۆریان فەرمودەی ( آحاد ) ن کە ( ظني الثبوت ) ە دەکرێت فەرمودەی قودوسیدا ،( صحيح ) بێت وە دەکرێت ( ضعيف ) بێت .**

**4- قورئان بە دەربرین و بە مانا لای خودا هاتۆتە خوارەوە .**

**- فەرمودەی قودوسی مانای لەلای خودایە وە لفظە کەشی لە لایەن پێغەمبەرە.**

**5- قورئان خوێندنەوەی پەرستنە ،هەروەکو هاتوە 1 وشە بە 10 خێرە.**

**-بەلام فەرمودەی قودوسی ناخوێندرێت ، خێری دەگەیشتێ بەخوێندنەوەی بەلام خێرەکەی وەك خێری قورئان نیە.**

# مەکی و مەدەنی ( مکی و مدنی )

**لە قازا نجە هەرەباشەکانی زانستی مکی و مدنی ،زانیاری لەسەر ئەو ئایەتانەی کە زوو دابەزیون وە ئەوانەی کە لە دوایی دابەزیون، ئەوەش بەسودە بۆ زانستی نسخ یان تایبەت ( تخصیص ).**

**باوترین ئەو پێناسانەی کە بۆ ( مکی و مدنی ) کراون:**

**مکی: ئەو ئایەتانەن کە پێش کۆچی پێغەمبەر .**

**مدنی:ئەو ئایەتانەن کەو لەدوای کۆچی پێغەمبەر دابەزیون . واتا بە مدنی ناسراوە ئەگەر لە مەکەش دابەزی بێت لەبەر ئەوەی دوای هیجرەتە ،وەك یەك وایە ئایا لە مکەیان لە مدینە یان لەسەفەر دا بێت.**

**پێناسەیەکی تریش هەیە کە دەلێت : مکی :ئەو ئایەتانەن کە لە مەکە هاتۆتە خوارەوە با پاش کۆچیش بێت،وە ئەو ئایەتانەی کە لە سفردا یان لە غەزا دابەزیون پێیان ناوترێت مکی یان مدنی .**

**پێناسەیەکی تریش هەیە :مکی :ئەو ئایەتانەن کە تایبەتن بە خەلکی مەکە .**

**مدنی :ئەو ئایەتانەن کە تایبەتن بە خەلکی مدینە.**

# واتای ( وحی ) سروش

**دەگوترێت لەسە وشەی ( وحی )لە زمانی عەرەبی ( وحیتُ الیە وأوحیتُ ) ئەگەر یەکێك قسە لەگەل یەکێك بکات کەسیش لێی تێنەگات ئەم رستەیە بەکار دەهێنن .**

**وحی : واتا ئاماژەی خێرا . وە بە مانای قسەی رەمزی دێت، وە دەکرێت بە مانای دەنگ بێت وە ئاماژە بە جەستە، وە لە زمانەوانیش بە مانای : شاردراوەو خێرایی دێت .**

**هەندێك ماناکانی وحی لە زمانەوانی :**

1- **نیگاو ئیلهام بۆ مرۆڤ . وەکو وەحی بۆ دایکی موسی** (وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ) . **واتا :**ئێمە دایکی موسامان ئاگادارکرد، کە شیری بداتێ و (پێمان وت) جا کاتێك مەترسیت پایدا کرد لەوەی کە پێی بزانرێت فڕێی بدەرە ڕووباری (نیلەوە) نە بترسە (لەوەی تووشی بەڵ ببێت) نە خەفەتیشی بۆ بخۆ، چونکە ئێمە بەڕاستی دەیگێڕینەوە بۆ لٖت و لەئایندەشدا دەیکەین بەیەکێك لە پێغەمبەرە پەیامدارەکان.

2- **نیگاو ئیلهام بۆ گیانداران. وەکو وەحی بۆ نەهەنگ** (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ) واتا :پەروەردگاری تۆ (ئەی ئینسان) نیگاو ئیلهامی کردووە بۆ هەنگ کە جێگە بۆ خۆی ساز بکات لە کون و کەلێنی چیاکاندا، هەروەها لە کەلەبەری درەختەکان و لەو شوێنانەش کە ئادەمیزاد بۆی ئامادە دەکات.

3- **ئاماژەی خێرا ،بۆ مەبەستی رەمز وەکو رەمزی زەکریا** ( فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَنْ سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ) **واتا :** (ئەوسا دوای دڵنیابوون) لە پەرستگاکەی هاتە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی و ئاماژەی بۆ کردن (کە لە بەرامبەر نازو نیعمەت و بەخششەکانی خواوە) بەیانیان و ئێواران تەسبیحات و ستایش بکەن.

4- **وەسوەسەی شەیتان بۆ رازاندنەوەی کاری خراپ لەناو دلی باوەردار** . (وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ) **واتا :**دڵنیابن کە شەیتانەکان شت دەخەنە دڵی لایەنگرەکانیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بکەن و (بەرگری لە بەتاڵیان بکەن) جا ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداری ئەو هاوەڵگەرو شەیتانانە بن، ئەوە بێگومان مانای وایە ئێوەش موشریک و هاوەڵگەرن.

5- **فەرمان کردنی خودا بۆ فریشتەکان** (إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ ) واتا: ئەی محمد(صلی الله علیه وسلم) یادی ئەوە بکەرەوە کاتێک پەروەردگارت وەحی و نیگای دەکرد بۆ فریشتەکان کە: بەڕاستی من یارو یاوەرتانم، کەوابوو ئێوەش دڵی ئیمانداران پابەندو دامەزراو بکەن، لەمەودوا منیش ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، دە ئێوەش لە سەرووی گەردنی ناپاکان بدەن و دەست بوەشێنن لە هەموو سەرپەنجەکانیان (تا کافرەکان شمشێریان پێ نەگیرێت).

## #چۆنیەتی وحی خودا بۆ فریشتەکان

1- **لە قورئان بۆمان هاتوە لەسەر قسەی خوداو فریشتەکان** .

(وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ) **واتا:** (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) باسی ئەوە بکە لە دێرین زەماندا) پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: بەڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێك دابنێم (بۆ ئاوەدانی و دینداری)، فریشتەکان وتیان: ئایا کەسێکی تیادا دەکەیتە جێنشین کە خراپەو تاوانی تیادا بچێنێت و خوێنڕێژی تێدا ئەنجام بدات؟! لەکاتێکدا ئێمە تەسبیحات و سوپاس و ستایشت دەکەین و قەدرو ڕێزی تۆ چاك دەزانین و بەدوورت دەگرین لەو شتانەی شایستەی تۆ نین، (لەوەڵامیاندا) خوا فەرمووی: بێگومان ئەوەی ئێوە نایزانن من دەیزانم.

2- **لە قورئان بۆمان باسکراوە کە خودای گەورە پاراستویەتی لە** ( **لوح المحفوظ** ) (بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ (21) فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ) **واتا :** (ئەوەی ئەوان دژایەتی دەکەن) ئەو قورئانە بەرزو بڵندو پایەدارەیە. (ئەوەی ئەوان دژایەتی دەکەن) ئەو قورئانە بەرزو بڵندو پایەدارەیە.

3- **وەکو چۆن کە باسکراوە هاتۆتە خوارەوە بەیەکجاری بۆ** ( **بیت العزه** ) **لە مانگی رەمەزان** (إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ )

**واتا :** ئێمە بەڕاستی قورئانمان دابەزاندۆتە خوارەوە لە شەوێکی بەفەڕو ڕێزداردا.

****زانایان راجیاوازیان لەسەر چۆنیەتی وحی هەیە :**

أ- **جبریل گوێی لە خودا بوە ، بە ووشەی تایبەت .**

ب- **جبریل لەبەری کردوە لە** ( **لوح المحفوظ** ) .

**ت- بەمانا بۆ جبريل هاتوە وە دەربرینەکە هی جبریلە یان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)**

****زانایانی (اهل السنه والجماعه) دەڵێن بۆچونی یەکەم راسترینیانە وە فەرمودەش دەربارەی هەیە. وە لە قورئانیش هاتوە**

(حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ) **واتا :** خۆ ئەگەر کەسێک لە هاوەڵگەران داوای پەنای لێ کردیت (ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار)، ئەوە تۆیش پەنای بدە هەتا گوێی لە فەرموودەکەی خوا (قورئان) دەبێت، پاشان بیگەیەنە بەو شوێنەی دەیەوێت و (ماڵ و گیان و ژیانی) تیایدا پارێزراوە، ئەم میهرەبانیە لەبەر ئەوەیە ئەوانە کەسانێکن نازانن (خواناسی چیە).

## #چۆنیەتی وەحی بۆ پێغەمبەران

**وحی دوو جۆرە: یەکەمیان راستەوخۆ ، دووەمیان ناراستەوخۆ (جبریل).**

**یەکەمیان : راستەوخۆ .**

**أ- لە شێوەی خەونێکی راست و دروست لە خەودا .**

**لە فەرمودەیەك کە دایکە عائشە بۆمان دەگێرتەوە دەلێت : ( یەکەم جار پێغەمبەری خودا خەوی راستی دەبینی ، وە خەوی نەدەبینی تەنها وەك رۆشنایی بەیانیان وابو ). متفق علیه**

**ئەمەش بۆ ئەوەیە کە پێغەمبەر رابهێنرێت لە لایەن خودای گەورەوە وە ئامادەبێت بۆ وحی ، هەتاکو وەحی بۆ هات ئەو خەوی راستی دەبینی . هیچ وحی بۆ پێغەمبەر نەهاتۆتە خواری کە لە خەودا بێت تەنها ئەو سورەتە نەبێت کە هەندێك دەلێن لە خەودا هاتۆتە خوارەوە کە فەرمودەکە بەم شێوەیەیە ( پێغەمبەر لە خەو هەلسا وە پێدەکەنی پرسیار کرا ئەی پێغەمبەر چی تۆی بە پێکەنین هێنا وتی :ئێستا دابەزی (انا اعطیناك الکوثر )) واتا :** بەڕاستی ئێمە خێر و چاکە و خۆشی) هەر دوو جیهان و ناوبانگی چاکەی (تۆمان (محمد (صلی الله علیه وسلم) بێ ئەندازە و بێ سنور کردوە (لە هەموو جەرخ و زەمانێکدا .

**وە پێغەمبەرانیش دەبوایە بە دوای خەونەکانیان برۆشتنایە چونکە جۆرێکە لە جۆرەکانی وحی وەکو چیرۆکی ابراهیم و اسماعیل .**

**خەوی راست تایبەت نیە بە پێغەمبەرانەوە بەلکو باوەردارانیش خەونی راست دەبینن بەلام وەحی نیە .وە کو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت : (لم یبق من النبوة الا المبشرات قالوا وما المبشرات قال الرؤیا الصالحة) هیچ لە پێغەمبەرایەتی نەماوە تەنها المبشرات (مژدە) نەبێت وترا المبشرات (مژدە) چیە ؟وتی خەونی راستە .**

**ب- قسەکردنی خودا لەگەل پێغەمبەران لە پشت پەردەوە . وەکو موسی و خودای گەورە** (وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ ) **وتا :** جا کاتێک موسا هات بۆ کات و شوێنی دیاریکراومان و پەروەردگاریشی گفتوگۆی ڕاستەوخۆی لەگەڵدا ئەنجامدا (دیارە لە حاڵەتێکی ڕۆحی و دەروونی زۆر بەرزدا بووە، کەوتۆتە جیهانێکی زۆر سەیرو خۆشەوە کە قەڵەم ناتوانێت

باسی بکات و زمان ناتوانێت وەسفی بکات، ئاخر ناحەقی نیە، پەروەردگاری ئەم بوونەوەرە گفتوگۆ لەگەڵ بەندەیەکی خۆیدا ئەنجام بدات، با پێغەمبەریش بێت، بۆیە لە خۆشیدا هاتە گفت و) وتی: (تو خوا، خوایە گیان، ئەی پەروەردگاری ئازیزم) خۆتم نیشان بدە تا تێر تەماشات بکەم، خوای گەورەش فەرمووی: هەرگیز (لە دنیادا) نامبینیت (بۆ دڵنیاکردنی لەوەی کە بەرگەی تەجەلای زاتی پەروەردگار ناگرێت) پێی فەرموو: بەڵام (ئەگەر هەر حەز دەکەیت) سەیری ئەو چیایە بکە، جا ئەگەر مایەوە لە جێگەی خۆیدا ئەوا لەوەودوا تۆش من دەبینیت، جا کاتێک پەروەردگاری خۆی نیشانی کێوەکەداو تەجەلای کرد، کێوەکەی سووتاند و ورد و خاشی کرد، موساش کەوت و لە هۆش خۆی چوو، ئینجا کاتێک هاتەوە هۆش خۆی (زانی داخوازیەکەی زۆر گەورە بووە) وتی: ستایش و بێگەردی و کەماڵ هەر سایشتەی تۆیە، من پەشیمانم لە داخوازیەکەم و گەڕامەوە بۆ لای تۆ و من یەکەم کەسم لە ئیمانداران.

**باسکراوە کە پێغەمبەرمان لە ( اسراء و معراج ) قسەی لەگەڵ خودای گەورە کردوە .**

## #چۆنیەتی وحی فریشتە بۆ پێغەمبەرمان

**بە چەند شێوە بوە :**

**1- زۆر قورس بوە لەسەر پێغەمبەرمان وەکو زەگی جەرەس وابوو، عبداللە ی کوری عمر دەڵێت پرسیارم لە پێغەمبەر کرد ،ئایا هەست بە وحی دەکەی ؟ وتی وەك گوێبیستی دەنگی جەرەس دەبم .**

**2- جبریل قورئانی کردۆتە ناو دلی پێغەمبەر.**

**3- لە وێنەی پیاو دەهاتە لای پێغەمبەر و قسەی لەگەڵ دەکرد.**

**4- دەڵێن دەهاتە خەوی پێغەمبەر.**

**5- خودای گەورە قسەی بەراستەوخۆ لە گەل پێغەمبەر کرد وەك لە( اسراو والمعراج )**

## زانینی یەکەم ئایەت و کۆتا ئایەت.

**هەندێك بۆچون دەربارەی ئەوەی کە کامە یەکەم ئایەتە :**

**1- راسترین بۆچون ئەو بۆچونەیە :کە یەکەم ئایەت دابەزی ( إقرأ بسم ربك .. ) کەلە صحیحی بخاری و مسلم دا هاتوە .**

**2- وتراوە کە یەکەم ئایەت دابەزی ئایەتی ( یا أیها المدثر )**

**3- وتراوە کە یەکەم ئایەت دابەزی ئایەتی ( الفاتحە )یە ، رەنگە ئەم بۆچونە لەگەل یەك سورەت بێت .**

**4- وتراوە کە یەکەم ئایەت دابەزی ئایەتی ( بسم اللە الرحمن الرحیم )ە چونکە لەسەرەتای هەموو سورەتەکان هەیە .**

**هەندێك بۆچون دەربارەی ئەوەی کە کامە کۆتا ئایەتە :**

1- **وتراوە کە ئایەتی ( سوو ) ربا کۆتا ئایەتە** ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ) **واتا** : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزکارو خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن.

2- **وتراوە کە ئەم ئایەتە کۆتا ئایەتە:** (وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ )

**واتا:** (خەڵکینە) لە سزاو تۆڵەی ڕۆژێک بترسن کە تیایدا بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، لەوەودوا هەموو کەس پاداشتی کاروکردەوەی خۆی وەردەگرێت و ستەمیان لێ ناکرێت.

3- **وتراوە کە ئەم ئایەتە کۆتا ئایەتە:** (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا)

واتا: ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان

**#کۆکردنەوە و ڕێکخستنی قورئان**

**قورئان کۆ کرایەوە پاش ئەوەی کە هەستکرا هەندێك ئایەت نسخ کرا یان حوکمەکەی یان خوێندنەوەی یان هەردوکیان .یان مردنی یان شهید بونی ئەو هاوەڵانەی کە قورئانیان لەبەر بوو .**

**هەر زوو خەلیفە راشدینەکان هەستیان بەوەکرد ، ئەوەبو خەلیفە ابو بکر الصدیق راوێژی لەگەل ئیمامی عمر کرد ،بریاریاندا کە قورئان کۆبکەنەوە .**

**قورئان بەسێ قۆناغ کۆکرایەوە .**

**1- بە ئامادەبونی پێغەمبەر هەروەکو لەو فەرمودەیە هاتوە ، لە زەیدی کوری ثابت ( ئێمە قورئا نمان لە لای پێغەمبەر دەنوسیەوە لەسەر پەلکە خورماو........هتد )**

**2- بە ئامادەبونی ابو بکر فەرمودەیەك هەیە کە لە صحیحی بخاری دا هاتوە ( دوای جەنگی ( اهل اليمامه ) باس لە شهید بونی چەند صحابیەك کرا کەقورئانیان لەبەر بوو بۆیە بریار درا کە قورئان کۆ بکرێتەوە ، بۆیە زیدی کوری ثابت بە بریاری ابوبکر هەلسا بە قورئان کۆکردنەوە ، زیدی کوری ثابت دەلێت :والله ئەگەر داوام لێبکرایە چیایەك بگوازمەوە ئەوەندە لەسەرم قورس نەدەبو لە کۆکردنەووەی قورئان . ئەو مصحەفەی لەلای ابوبکر بوو دواتر هەلگیرا لە لای ئیمامی عمر دواتر لە لای حفصەی کچی ئیمامی عمر )**

**3- بە ئامادەبونی ئیمامی عثمان : لە چیرۆکێدا هاتوە کە بخاری بۆمان دەگێرتەوە :**

**حذيفه ي اليماني پێشنیاریکی خستە روو بۆ ئیمامی عثمان ،کە ئیمامی عثمان لە غەزا بوو لە ئەرمینیاو ئاذربایجان و ئەهلی شام و عیراق، حذيفه لەوە ترسا کە دوبەرەکی بکەوێتە ناو موسمانانەوە لە خوێندنەوەی قورئان نەوەك وەك و یەهودیەکان و مسیحیەکان جیاوازی بکەوێتە ناو مسلمانانەوە، پێی وت یەکێك بنێرە بۆ لای حفصەی کچی ئیمامی عمر کە مصحەفەکەی بۆ بنێرێت،و نسخ دەکات و بۆی دەگەرێنێتەوە ،بۆیە داوی لە زیدی کوری حارثە و عبدالله ی کوری زبیر و سعید بن عاص و عبدالرحمن ی کوری حارث کرد کە مصحەفەکە نسخ بکەن ئیمامی عثمان بەسێ کەسەکەی وت ئەگەر ئێوە ناکۆك بون لە هەر نوسینێك ئاوا بە زمانی قورەیش بنوسن چونکە بەڕاستی**

**به زمانی قورەیش دابەزیوە ،نەسخیان کردوو  وە ئەو وەرەقە و ئەو نەسخانەی تریان هەموو سوتاند لەبەر ئەوەی نەبێتە فیتنە لە ناو ئومەتی ئیسلام .**

**ڕێکسختن:**

**کۆدەنگی زانایان و دەقەکان لەسەرە کە ڕێکخستنی قورئان ئایەتەکان لەلای خودایە وە بوە . وەهیچ گومانی تێدا نیە . کە قاضي ابو بکر دەلێت : ڕێکخستنی ئایەتەکانی قورئان داخوازیەکی پێویستەو واجبە ،چەنکە جبريل دەی فەرمو ( ضعوا آية كذا في موضع كذا ) فلان ئایەت لە فلان شوێن دابنێن.**

**وەکو:** (وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ) **جبريل داوای کرد کە لە نێوان ئایەتی ( ربا و قەرز)دابنرێت.**

**وە ڕێکخستنی ( سورەتەکان ) دوو بۆچون هەیە :**

1- **لەلای خوداوە دانراوە .**

2- **بە بۆ چونی صحابەکان بوە .**

**زۆر بەی زانایان لەگەل بۆچونی دووەمن .**

**أسباب نزول ( هۆکارەکانی دابەزین )**

-1 **باس لە ڕووداوێك دەکات ، ئایەتێك یان چەند ئایەتێك دەربارەی ئەم ڕووداوە دێتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر کە ئەم ئایەتە دابەزی** (( وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ )) **واتا:** ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) سەرەتا عەشرەت و تایەفە و کەس و کاری نزیکت بێدار بکەرەوە و بترسێنە. **یەکسەر پێغەمبەر چووە دەرەوەو هۆزەکەی خۆی بردە سەر کێوی ( صفا )پێی وتن ئەگەر پێتان بلێم ئێستا چەند سوارچاکێك .... دواتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە** (( تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ )) **واتا:** دەستەکانی بشکێت ئەبو لەهەب و ڕسوا بێت، ئاشکرایە کە هەر ڕاسوایش دەبێت و (لەناو دەچێت).

2- **یان پرسیار لە پێغەمبەر کراوە پاشان ئایەت هاتۆتە خوارەوە وەك پرسیاری ( خەولەی کچی ثعلبة )** (( قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ))

**واتا:** ئە ی محمد (صلى الله عليه وسلم) بێگومان خوا بیستی و وەریگرت وتووێژی ئەو ئافرەتەی کە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات دەربارەی هاوسەرەکەی، سکاڵای خۆیشی بۆلای خوا دەبات، خوایش گوێی لە گفتوگۆکەتان بوو، بەڕاستی خوا بیسەرو بینایە. (چوار ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە دەربارەی خەولەی کچی ثەعلەبەو مێردەکەی هاتۆتە خوارەوە... ڕۆژێک مێردەکەی لێی تووڕە دەبێت و پێی دەڵێت: تۆ لەجێگەی دایکمی، خەولە دێت بۆ خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، باسەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، دوای تاوێک حالەتی وەحی بەسەر پێغەمبەردا دێت و چوار ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە دادەبەزێت).

***ئەمەش مانای ئەوەنیە کە هەموو ئایەتەکان هۆکاری دابەزینیان هەیە .**

## چەندئایەتێك لەسەر صەحابە هاتۆتە خوارەوە

**بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە کەدەڵێ ( سەعدی کوڕی وەقاص )دەڵێ: لەسەرمن چوار ئایەت لە قورئان دابەزیوە**

1- **دایکم سوێندی خواردبوو نە بخوات و نە بخواتەوە تاکو موحەممەد جێنەهێڵم ئەم ئایەتە دابەزی** ((وَإِنْ جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ )) **واتا:** خۆ ئەگەر زۆریان لێکردیت تا هاوەڵ و هاوبەشم بۆ بریار بدەیت، بێ ئەوەی زانست و زانیاریت هەبێت دەربارەی، ئەوە ملکەچیان مەبە و بەگوێیان مەکە، دڵنیاش بن کە گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ئەو کاتە ئاگادارتان دەکەمەوە لەو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا.

2- **لە خزمەت پێغەمبەر شمشێرێکم هەلگرت و زۆر سەرسام بووم پێی وتم ئەی پێغەمبەر ئەم شمشێرەم پێببەخشە ئەم ئایەتە دابەزی** ((يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ )) **واتا:** ئەی محمد(صلى الله عليه وسلم) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی دەسکەوتەکان، تۆ بڵێ: هەموو دەسکەوتەکان هی خواو پێغەمبەرن (هەر ئەوان بۆیان هەیە بڕیاری چۆنیەتی دابەش کردنی بدەن)، کەواتە لە خوا بترسن و چاکسازی نێوانی خۆتان بکەن (مەیەڵن لەسەر تەماعی دنیا نێوانتان بشێوێت) و فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی بن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

3- **من نەخۆش بووم پێغەمبەر هاتە لام پێم وت ئە ی پێغەمبەر دەمەوێ مالم بەش بکەم و وە وەسیەت بکەم بە نیوەیی؟ وتی:نەخێر وتم بە سێیەکی ؟ بێدەنگ بوو لەدوای ئەم رووداوە سێیەك رێگەی پێدرا** ((كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ )) **واتا** : پێویستکراوە لەسەرتان کاتێك یەکێکتان مەرگی نزیك بووەوە سامان و ماڵ و دارایيەکی بەجێ دەهێشت، با وەسیەت بکات کە هەندێکی بدرێت بە دایك و باوکی و خزمانی بەشێوەیەکی جوان و لەبارو ئەمە پێویست و ئەرکە لەسەر خواناس و پارێزکاران.

4- **من مەشرووبم دەخواردەوە لەگەل ئەنصارەکان کەسێك لە لووتمی دا ڕۆیشتم بۆلای پێغەمبەر:ئەو ئایەتە دابەزی کە مشروبی حرام کرد .**

## چەند ئایەتێك موافق بوون لەگەل قسەکانی ئیمامی عومەر

-1 **کە ئەم ئایەتە دابەزی** ((ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ )) **واتا:** لەوەو دوا نوتفەکەمان کردووە بە خۆ هەڵواسەرێك (سەرە مێکوتەیەك) پاشان خۆهەڵواسەرەکەمان کردووە بە گۆشتپارەیەك، ئینجا (شێوازی) گۆشتپارەکەمان بە پەیکەری ئێسك گۆڕیوەو بە گۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشیوە، ئەوساڵە شێوەیەکی تردا دەرمان هێناوە (کە شێوەی ئادەمیزادێکی ڕێکو پێکە و ڕۆحی پێ بەخشراوە)، بە ڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆزو موبارەکە **وتم فتبارك الله أحسن الخالقين**(( فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ )) **واتا:** وچاکترین بەدیهێنەرو چاکترین دروستکارە.

2- **یەهودیەك گەیشتە ئیمامی عومەر و پێی وت : ( جبریل باسی دۆستەکەتانی کردوە کە دوژمنی ئێمەیە منیش پێم وت ( من کان عدوا لله وملائتكه ورسله.... ) یەکسەر ئەم ئایەتە دابەزی:**(( مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ

وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ )) **واتا :** ئەو کەسەی دوژمن بێت بە خواو فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی، بەتایبەت جوبرەئیل و میکائیل، ئەوە با بزانێت و دڵنیا بێت کە خوای گەورە دوژمنی کافرو بێباوەڕانە.

**3- کە ئیمامی عومەر گوێبیستی چیڕۆکی ( عائیشە ) بوو وتی:( سبحانك هذا بهتان عظیم ) یەکسەر ئەم ئایەتەدابەزی ((سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ))**

**4- ئیمامی عومەر وتی ئەی پێغەمبەر با ( مەقامی ئیبراهیم )بکەین بە شوێنی نوێژکردن. ئەم ئایەتە دابەزی:**

((وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِلنَّاسِ وَأَمْنًا وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَنْ طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ )) **واتا** : (یادی ئەوەش بکەنەوە) چۆن ئەم ماڵەمان (کەعبە) کردە جێگای کۆبوونەوەی خەڵکی، کە بەوپەڕی هێمنی و ئاسایش و ئاسوودەییەوە لەوێ بەیەك بگەن (دە ئێوەش، خەڵکینە) مەقامی ئیبراهیم کە شوێنی تایبەتی خواپەرستی ئەو بوو، بیکەنە جێگای خواپەرستی و نوێژ، ئینجا فەرمانماندا بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کە ئەو ماڵەم خاوێن بکەنەوە (لە چەپەڵی ماددی و مەعنەوی) بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسوڕێنەوەو (طواف) دەکەن و تیایدا دەمێننەوەو (اعتکاف) دەکەن هەروەها بۆ کڕنووشبەران و سووژدەبەران.

## بۆچی قورئان زیاتر لەماوەی 20 ساڵ دابەزی ؟

1- **بۆ بەهێزکردنی دڵی پێغەمبەر.**

2- **بۆ تێگەیشتننی و ئاسان پێگەیشتنی .**

3- **بۆ ئەوەی لەگەڵ روداوەکان دەهاتە خوارەوە و ەپاڵپشتی پێغەمبەر و هاوەڵانی دەکرد.**

4- **بۆئەوەی تەحەدای عەرەبی پێدەکرد.**

5- **بۆ ئەوەی هەر کە ئایەتێك بهاتبایە خوارەوە ،ئەوە پشتی کافرەکانی پیّ لە زەوی بدات.**

## #الناسخ والمنسوخ

**پێناسەی ( نسخ ) : هەلگرتنی حوکمی شەرعی بە حوکمیکی شەرعیەکی تر،کە لە دوای یەکەم هاتبێتە خوارەوە،**

**منسوخ: ئەو حوکمەیە کە هەلگیراوە ،**

**ناسخ : ئەو حوکمەیە کە ئەوەی پێشەخۆی هەلدەگرێت ، وەکو ئایەتەکانی ( میرات ) منسوخە بە ئایەتەکانی وەسییەتی دایك و باوك.**

**گەورەیی زانستی ( ناسخ و منسوخ )**

**زانینی ئەو زانستە زۆر زۆر گرنگە ، چونکە زانایان و شەرعناسان وە ئسولیەکان گرنگیەکی زۆریان پێداوە وە بۆ زانینی زانستی ( نسخ )چەند رێگایەك هەیە .**

1- **نەقل بووە لە پێغەمبەر کە دەفەرمویّ ( کنت نهیتکم عن زیارە القبور الا فزروها )**

2- **زانینی ئەو ئایەتانەی کە پێشتر دابەزیون.**

**واتاكانى ( نسخ ) :**

1- **سرينەوە لادان ديّت :** ( وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ) **واتا :** )ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێش تۆ هيچ پێغەمبەرێكی پەيامدار و بێ پەيامان ڕەوانە نەكردووە ئاواتی نەخواستبێت بەباوەڕ هێنانی قەومەكەی، بەڵام كاتێك ئاواتی خواستووە شەيتان ئەوەی بە فرسەت زانيووە، شتی نابەجێی تێكەڵ بەئاواتەكەی كردووە، ئينجا خوايش فريای كەوتووە و ئەوەی شەيتان فڕێی داوەتە نا ئاواتەكەيەوە، سڕيويەتيوە، لەوەودوا خوای گەورە ئايەت و فەرمانەكەی خۆی چەسپاو دامەزراو كردووە، خوا خۆی زاناو دانايە.

2- **وە بە مانای گۆڕين و نەقليش ديّت.**

**بەشەكانى ( نسخ )**

1- **نەسخ كردنى قورئان بە قورئان :ئەمەشيان زانايان لە سەرى كۆكن .**

2- **نەسخ كردنى قورئان بە فەرموودە : ئەمەشيان دوو بۆچوونە :**

أ- **نەسخ كردنى قورئان بە فەرموودەی ( احاد )كە كۆدەنگى زانايانى لە سەرە كە ئەمە دروست نيە**

ب- **نەسخ كردنى قورئان بە فەرموودەی( المتواتر )كە ئەمەيان زانايان ڕێگايان پێداوە وەكو ئيمامى ماليك ، ئيمامى ئەبوحەنيفە ،ئيمامى ئەحمەد .**

3- **نەسخى سوننە بە قورئان ئەم جۆرەشيان هەموو زانايان لەسەرى كۆكن وەكو ڕووكردنە ( بيت المقدس ) بەلام نەسخ كرا بە قورئان**

4- **نەسخى سوننە بە سوننە : موتەواتر بە موتەواتر -ئاحاد ئاحاد.**

**#جۆرەكانى ( نسخ ) لە قورئاندا :**

1- **كە حوكم و خوێندنەوەی ( نسخ )بوە . عائشە دەلێت : ( كان فيما انزل : عشر رضعات معلومات فنسخن بخمس معلومات ،فتوفي رسول الله وهن مما يقرأ من القرآن ) ئەوە دەليلە لەسەر ئەوەی كە نسخ هەيە كە بە حوكم و بە خوێندنەوەی.**

2- **حوكمەكەيان ( نسخ ) بوە جگە لە خوێندنەوەيان . هەندێك وێنە لەم جۆرە ( نسخ )ە**

(وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ) **واتا :** ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو (هەموولايەك) هەر خوا خاوەنيەتی، جا ڕوو بكەنە هەر لايەك خوا لەو جێ يە ئاگای لێتانە، بەڕاستی خوا فراوانگيرو زانايە.

**زانايان دەلێن ئەم ئايەتە ( منسوخ )ە بە ئەو ئايەتەی دواوە .**

(قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ) **واتا :** (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسورانی ڕووخسارت ڕوو بەئاسمان دەبينين (كە بە هيوای

ڕووگەیەکی تایبەتیت، ئێمەش ئاگاداری نیازی دڵت بووین) سوێند بەخوا ئێمەش ڕووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕووگەیەك پێی ڕازی و خۆشنوود بیت، دە ڕووت وەربچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (المسجد الحرام) و ئێوەش ئەی موسوڵمانان لە هەر کوێ بوون، بەرەو لای ئەوێ ڕووتان وەربچەرخێنن، بەڕاستی ئەوانەش کتێبیان پێ گەیشتووە (لە گاورو جوو) چاك دەزانن کە (ئەم گۆڕانی ڕووگەیە) حەقیقەت و ڕاستیە و فەرمانی پەروەردگاریانە (لە تەورات و ئینجیلدا ئاماژەی بۆ کراوە) و خوا هەرگیز بێ ئاگا نیە لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

3- **خوێندنەوەی ( نسخ ) بوە جگە لە حوکمەکەی واتا حوکمەکەی ماوە . وەکو ئایەتی رجم**

**( اذا زنا الشيخ والشيخوخة فارجموهما البتة نكالا من الله والله عزيز حكيم )**[1]

**مەرجەکانی نسخ:**

1- **دەبێت کار بە حوکمی منسوخەکە نەکرێت .**

2- **دەبێت بەلگە لەسەر ( منسوخ )ەکە هەبێت کە دەقێك دێت و حوکمی دەقەکەی پێشەخۆی لادەدات .**

3- **نابێت ( ناسخ ) پەیوەست بێت کاتێکی دیاری کراو.**

**# هەندێك لە زانایان دەلێن نابێت کەسێك قورئان تفسير ( راڤە ) بکات کە نەزانێت لە ( ناسخ و منسوخ و اسباب نزول )**

**القراء والقراءات ( خوێنەرانی وە خوێندنەوەی )**

**ئەو هاوەڵانەی کە بەناوبانگ بوون لە خوێندنەوەی قورئان لە هاوەڵان:**

**چوار خەلیفەکە ،ابی کوری کعب ،زیدی کوری ثابت ،ابو درداء ،ابو موسى الاشعرى .**

**سودەکانی جۆراو جۆری قراءات :**

1- **بۆ پاراستنی قورئان لە گۆرین و لادان سەرەرای ئەو هەمو جۆرە خوێندنەوەیە.**

2- **ئاسانکاری بۆ ئومەت .**

3- **رونکردنەوەی ئەو ئایەتانەی کە ( محکم )ن لە قراءاتەکانی تر دەردەکەوێت .**

**جوان خوێندنەوە ( تجويد ) و ئادابەکانی خوێندنەوە.**

**تجويد : واتا جوان خوێندنەوەی قورئان بەو شێوەی کە دابەزیوە ،**

***قورئان خوێندنەوە سوننەتێکە لە سوننەتەکانی ئیسلام .**

***وە زۆر خوێندنەوەی کارێکی پەسندە تاکو موسولمان دڵی زیندووبێت و دڵی روناك ببێتەوە بە قورئان .**

**خوێندنەوەو نیەت پاکی ئەوا پاداشتی زۆری بۆهەیە هەروەکو :**

**( من قرأ حرفاً من كتاب الله فله حسنة والحسنة بعشر امثالها )**

**( إقرأوا القرآن فانه يأتي يوم القيامة شفيعا لأصحابه )**

**ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئان :**

---

[1]- الاتقان في علوم القرآن. 345

1- چاكتر وایە كە بەدەست نوێژەوە بخوێندرێت .

2- دەبێت بە خشوع و بە ئارمی بێت.

3- دەبێت بە ( اعوذ باللە من الشطان الرجیم ) دەست پێبكرێت . لەبەر ئەو ئایەتە (( فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ )) واتا : ئینجا كاتێك قورئانت خوێندو دەورت كردەوە، ئەوە پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێكراو.

4- پێویستە بە ( بسم اللە الرحمن الرحیم ) دەست پێبكرێت .

5- دەبێت بە كاریگەریەوە بخوێندرێت ، بە شێوەیەك گەیشتە ئەو ئایەتانەی ترسیان تێدایە بترسێت .

6- دەبێتبە دەنگ خۆشیەوە بخوێندرێت .

7- دەنگ بەرز كردنەوە .

**تەفسیر( ڕاڤە )**

**واتا :رونكردنەوەی ئایەتەكانی قورئان .**

**: بەناو بانگترین مفسیر( ڕاڤەكار ):**

**چوارخەلیفەكان ، ابن مسعود ، ابن عباس ، ابی بن كعب ، ابوموسى الأشعرى ، عبداللە بن زبیر .**

**لە چوار خەلیفەكان ئیمامی عەلی زۆرترین تەفسیری لێ گێردراوەتەوە وە ابن عباس ئەو تەرجومانی قورئانە كە پێغەمبەر بۆ پاڕاوەتەوە لە خودا ( اللهم فقه فى الدين وعلمه التأويل ) وەلە ڕیواتێكی ترەوە هاتووە وتوویەتی ( اللهم علمه الحكمه )**

**قوتا بخانەی تەفسیر لە مەككە : بە ڕابەرایەتی( ابن عباس )[2] بەناوبانگترین قوتابیەكانی :**

**سعید بن جبیر. ، مجاهد بن جبر.[3] ،عكرمة ، طاوس بن كیسان ، عطاء بن ابی رباح**

**قوتا بخانەی تەفسیر لە مەدینە :بە رابەرایەتی ( ابی بن كعب )بەناوبانگترین قوتابیەكانی :**

**ابو عالیة ، محمد بن كعب القرظی ، زید بن أسلم**

---

[2] ناوی ( عبداللە ی كوری عباسی كوری عبدالمطلبة ، ئەو تەرجومانی قورئانە ،ئەو سەركردەو رابەری ( مفسیر )ەكانە كە بەیهەقی لە ابن مسعود دەگێرێتەوە : ( باشترین مفسیر ابن عباسە ) دەگێرنەوە كە عمر وتی :ئێوە چی دەلێن دەربارەی ( اذا جاء نصر اللە والفتح ) وتیان : دەبێت سوپاسی خودا بكەین كە سەركەوتن و فتحی بە ئێمە بەخشی :عمر وتی :تۆش وا دەلێی ابن عباس وتی نەخێر /وە وتی : ئەوە ئەجەلی پێغەمبەر نزیك بوە . عمر وتی: من نەم دەزانی ئەی ابن عباس )

[3] - رابەری تابعینەكانە لە تفسیر كردنی قورئان وە لە هەموشیان شارەزاتر بوە لە تفسیر كردنی قورئان ، مجاهید دەلێت : 30 جاران من تفسیرم لە ابن عباس وەرگرتوە . ئیمامی نووی دەلێت : ( ئەگەر تەفسیرێك لەلای مجاهید هات وەری بگرە ).

**قوتا بخانەی تەفسیر لە عیراق بەرابەرایەتی ابن مسعود**

**علقمة بن قيس ، مسروق ، الأسود بن يزيد ، رماة الهمدانی، عامر الشعبی ، الحسن البصری ، قتادة.**

**جۆرەكانی تەفسیر :**

1- **تفسير( المأثور)**

**واتا تەفسیركردنی قورئان بة قورئان**

**بەناو بانگترین تەفسیرەكانی ( المأثور)**

**جامع البيان فی تفسير القران للطبری ، بحرالعلوم للسمرقندی ،الكشف والبيان عن تفسير القران للثعلبی**

**معالم التنزيل للبغوی ، محرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز لابن عطية ، تفسير القرآن العظيم لابن كثير .**

**الجواهر الحسان في تفسير القرآن الثعالبي . الدرالمنثور في تفسير المأثور للسيوطي .**

2- **تفسير ( الرأي)**

**مفاتيح الغيب للرازي . انوار التنزيل واسرار التأويل للبيضاوي ، مدارك التنزيل وحقائق التأويل للنسفي . لباب التاويل في معاني التنزيل للخازن. البحر المحيط لابي حيان . غرائب القرآن ورغائب الفرقان للنيسابوري . تفسير الجلالين لاجلال الدين المحلي والجلال الدين السيوطي . السراج المنير . ارشاد العقل لابن السعود. روح المعاني للالوسي.**

3- **التفسير المعتزله .**

**تنزية القرآن عن الطاعن للقاضي عبدالجبار . آمالي لشريف المرتضي . كشاف عن حقائق التنزيل للزمخشري .**

4- **الشيعه**

**بەناوبانگترین تفسیر ەكانی :**

**مرآة النوار للكارزاني . تفسير الحسن العسكري . مجمع البيان للعلوم القرآن للطبرسي . الصافي لملا محسن الكاشي.**

**تفسير القرآن عبدالله العلوي . بيان السعادة لسلطان محمد الخراساني .**

5- **لزيدية**

1- **فتح القدير للشوكاني .**

6- **التفسير الصوفية**

**تفسير القرآن العظيم للتستري. حقائق التفسير للمسلمي، عرائس البيان لابي محمد الشيرازي .التفسير المنسوب لابن عربي.**

**باشترين تفسيرى ئەم سەردەمە :**

1- **الجواهر في تفسير القرآن: للشيخ طنطاوي: لەم تەفسیرە زۆر گرنگی بە فەلەك ناسی دەدات .**
2- **تفسير المنار: لسيد رشيد رضا: زیاتر گرنگی بە هەلسانەوەی موسلمانان دەدات وە بەئاگا بێنەوە ،**
3- **في ظلال القرآن لسيد قطب: زیاتر گرنگی بە مەنهەج دەدات وە بەشێوەیەکی ئەدەبی نوسیویەتی.**
4- **التفسير البيان للقرآن الكريم لعائشة بن الشاطئ. زیاتر گرنگی بەلایەنی ئەدەب و زمان دەدات.**

**#محكم و متشابه**

**محكم واتا هیچ دژیەکی تێدا نیە .**

**متشابه: هەندێك بە هەندێکیان دەچن لە حەق و راستگۆ و ئیعجاز.**

**وتراوە ( محكم ) ئەو ئایەتانەن کە مەبەستەکەی بزانین ،یان بە روونی یان بە لێکدانەوە . وە تراوە ماناکەی رونە هیچ تەفسیرێك هەلناگرێت،وە( متشابە ) بە پێچەوانەوە .**

**وە وتراوە ( متشابە ) تەنها خودای مەبەستەکەی دەزانێت ، وەکو : رۆژی دوایی –دەرکەوتنی دجال – وەك سەرەتای ئایەتەکانی هەندێك سورەت ( طه –الم –الر – عسق... )**

((هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آَيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آَمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ)) ئەو خوایە زاتێکە کە قورئانی بۆ سەر تۆ (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ناردە خوارەوە، بەشێک لە ئایەتەکانی دامەزراو و پایەدارو ڕوون و ئاشکران، ئەوانە بنچینەو بناغەی قورئانەکەن و هەندێکی تریشی واتای جۆراوجۆر هەڵدەگرن و بە ئاسانی نازانرێن، جا ئەوانەی کە لە دڵیاندا لاری و لادان هەیە، حەز لە حەق و ڕاستی ناکەن، ئەوانە شوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون کە مانای جۆراو جۆر و فراوانیان هەیە، بۆ ئەوەی فیتنە و ئاشوب و ناکۆکی و دووبەرەکی دروست بکەن، یان بۆ ئەوەی لێکدانەوەی هەڵەی بۆ هەڵبەستن، لە حاڵێکدا کە لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە هەر خوا خۆی بە تەواوی دەیزانێت، جا ئەو کەسانەی کەلە زانستدا ڕۆچوون دەڵێن: ئێمە باوەڕی دامەزراومان بەهەر هەموو (ئەو ئایەتانە)هەیە کە لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە و فەرمایشی ئەوە، (لەڕاستیدا) بێجگە لە خاوەن بیر و ژیرەکان یاداوەری وەرناگرن و بیرناکەنەوە (لەم قورئانە .

**سێ بۆچون هەیە دەربارەی ئەم بابەتە :**

-1 **هەموو ئایەتەکان ( محكم ) ن واتا رونن و یەك مانا هەڵدەگرێن.** (كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آَيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ) **واتا :** ئەمە کتێب و پەیامێکە (لەو پیتانە پێکهاتووە) کە ئایەت و یاساکانی بەشێوەیەکی ڕاست و دروست پێکەوە پەیوەست کراون و جۆشدراون، پاشان درێژهیان پێدراوە و ڕوون کراونەتەوە لەلایەن زاتێکەوە کە داناو بە ئاگاو لێزانە.

2- **هەموو ئایەتەکان ( متشابه ) ن ،واتا :** ( اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا مَثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ) واتا: خوا جل جلا لە جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە کە ئەم قورئانەیە، (لە جوانی داڕشتندا) بابەتەکانی لە یەك دەچن، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتەوە، جا کارکردی ئەم قورئانە ئەوەیە کە: تەزوو دەهێنێت بە گیان و پێستی ئەوکەسانەدا کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵ و دەروونددا هەیە، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاك دەبێت بۆ یادی خواو خواپەرستی ئا ئەوە هیدایەت و ڕێنموویی خوایە کە هەر کەس شایستە بێت هیدایەت و ڕێنموویی دەکات بۆ پلەو پایە بەرزانە، ئەوەش کە ڕێبازی خوا ون بکات کەس نیە ڕێنموویی بکات.

3- **بۆچونە راستەکە ئەمەیە کە دەی کەنە دوو بەش ( محكم - متشابه ) .**

# العام والخاص ( گشتی و تاییەت )

**ئایا پەندو عبرەت لە دەربرینی گشتیە ( عموم اللفظ ) یان هۆکاری تاییەت ( خصوص السبب )؟ ئیمامی سیوطي دەڵێت : راستەکە هی یەکەمیانە .**

**زۆر ئایەت دابەزیوە وە حوکمەکەشی گشتیە واتە تاییەتی نیە وەك ئایەتی (( ظهار )لەسەر( سلمە بن صخر ) وە ئایەتی ( اللعان ) لەسەر ( هلال بن امیە )وە ئایەتی ( حدالقذف )لەسەر ( رماە عائشە ).**

**کەچی دەربڕینەکە گشتی نیە . دەڵێن ئەو ئایەتانە لە ڕێڕەوی خۆیان زیاتر بوونە وەلەبەر بەڵگەی تر .**

**وە ( زمخشري ) دەڵێ: دەکرێ هۆکارەکە تاییەت بێت وە حوکمەکەشی گشتی بێت .**

**دەڵێن ئەم ئایەتە لەسەر یەك کەس هاتە خوارەوە**(( وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ )) **واتا :** هەندێ کەس هەن قسەو گوفتارو دەم پاراوییان لە بارەی ژیانی ئەم دنیایەوە سەرسامت دەکات، خوایش بە شایەت دەگرێت و دەڵێت: دڵ و زمانم یەکسانن، لە کاتێکدا ئەو سەرسەختترین کەسە لە هەموو جۆرە دوژمنایەتیەکدا.**بەلام دواتر بوو بە گشتی**

**وە ئایەتی:**(( وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ )) **واتا :** دەستی پیاوی دزو ئافرەتی دز ببڕن لە پاداشتی کاری نارەوایاندا ئەمەش تۆڵەیەکە لە لایەن خواوە، خوا باڵادەست و دانایە (لە بڕیاردانی ئەو سزایەدا، ئەڵبەتە ئەم سزایە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا جێبەجێ دەکرێت، کە: هەموو کەسێک ژیانی مسۆگەرە و هەمووان دەستی یارمەتی بۆ یەکتر درێژ دەکەن، هەروەها لە ساڵانی گرانیدا دەست نابڕدرێت).

**دەڵێن ئەم ئایەتە لەسەر ژنێك دابەزیوە کە دزی کرد . پرسیار کرا لە ( ابن عباس ) ئایا ئەم ئایەتە گشتیە یان تاییەتیە وتی :گشتیە .**

## چیرۆکەکانی قورئان :

**باس لە چیرۆکی گەلانی ڕابردوو دەکات بۆ پەند و ئامۆژگاری ، ئەم چیرۆکانە ڕاستین خەیالی نین .**

**جۆرکانی چیرۆك له قورئاندا :**

1- **چیرۆکی پێغەمبەران.**

2- **چیرۆکێك تایبەت بێت بە ژیانی پێغەمبەر :وەك غەزای بەدر ، أحد ،حنين ،تبوك ، أحزاب ،اسراء والمعراج ، کۆچ .**

3- **هەندێ چیرۆك تایبەتە بە کەلان و هۆزو کەسایەتی ڕابردوو وەك( طالوت جالوت ، اصحاب الكهف ،ذوالقرنين، قارون ، اصحاب السبت،مريم ،اصحاب الأخدود ،اصحاب الفيل ،أصحاب الجنة ).**

**ئیعجاز:**

**واتا چەسپاندنی بێتوانایی بەرامبەرپێچەوانەی توانینە.**

**خودا تەحەدای هەموو عەرەب و مرۆڤەکان دەکات گەرچی هەموویان پشتیوانی یەکتربن کە وێنەیەك بهێنن ،لەگەل ئەو هەموو فەصاحەت و بەلاغەتەی کە عەرەب هەیان بوو نەیان توانی وەناشتوانن وێنەیەك بهێنن**

.

**بە سێ قۆناغ ئەم تەحەدایە کرا :**

1- **تەحەداکردن کە وێنەیەك وەکو قورئان بهێنن** (( قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا )) **واتا**: ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر هەموو ئادەمیزادو پەریەکان کۆ ببنەوەو (هەوڵی بەردەوام بدەن تا) قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر.

2- **تەحەداکردن بە دە سورەت** (( أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ )) واتا بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد قورئانی هەڵبەستووە، پێیان بڵێ: جا ئێوەش دە سوورەتی هەڵباستراو وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، هەر کەسیش لە خوا گەورە بەدەر، دەتوانن، بانگ بکەن (بۆ هاوکاریتان پەنای بۆ بەرن) ئەگەر ڕاست دەکەن.

3- **تەحەداکردن بە یەك سورەت ئەگەرچی کورتیش بێت**(( أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ)) بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد (صلى الله عليه وسلم) قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێک وەک سوورەتەکانی دابڕێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کەیارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن.

**موعجیزەی قورئان لە چ دایە**

1- **موعتەزیلەکان دەڵێن : ئیعجازی قورئان لە هەموو قورئانە نەك لە سورەتێك یان چەند ئایەتێك .**

2- وه هەندێ دەڵێن : موعجيزه بە زۆری و کەمی نيه هەر هەموو قورئـان موعجيزەيه .

3- دەڵێن موعجيزه بە سورەته ئەگەرچی کورتيش بێت .

**جۆرەكانی ئيعجاز:** ئيعجازی زمانەوانی ،ئيعجازی عيلمی (زانستی) ، ئيعجازی تەشريعی ،ئيعجازی گەردونی .

**سەرچاوەكان**


1- قورئـان
2- الاتقان في علوم القرآن.
3- مباحث في علوم القرآن .
4- موقع ويكيپيديا.
5- التفسير والمفسرون .
6- تفسيری ئـاسان .
7- شرح طيبة النشر في القراءات العشر.